## «سوڕەی ئەحزاب ـ لاپەڕی ٤١٨»

**ئەحزاب: دەستە و گرۆکان [ف] دسته و گروه**

٣ **بریکار:** وەکیل، نایب [ف] وکیل

٤ **هەناو:** ١ ـ ناو، هەناف، جەرگ و ناو ٢ ـ زراو، ورە، غیرەت [ف] ١ ـ احشاء ٢ ـ زهره، شجاعت

٥ **ئانقەس:** ئانقەست [ف] عمداً

٦ **خوێش:** خزم، کەس و کار، قەوم [ف] فامیل، خویش

١٢ **عان:** کات، وەخت، دەم [ف] هنگام، دَم

١٦ **هیچ دادێکی ئێوە نادا:** بەهرە و قازانجێکی بۆنگۆ تێدا نیە [ف] فایدەای برای شما ندارد

٢٦ **ئەهلی کتێب:** مەبەست کەساتێک کە لە تایفەی بەنی قەریزە بوُن و پشتیوانیان لە تاقمەی ئەحزاب دەکرد [ف] اهل کتاب

٣٢ **خاو:** شل و تەنبەڵ، سست و بێ هێز [ف] سست و بی‌حال (مەبەس ناسک و نەرم و بەنازەوە)

٣٧ : مەبەست زەید کوڕی حارسە کە بەردە و زڕکوڕی پێغەمبەری بوُ و ژنەکەشی زێنەب کچی حەجشی کە کچە پوُری پێغەمبەری بوُ

٤٨ **دوڕاز:** دوُڕوُ، ناڕاست [ف] دورو، منافق

٥٠ **دۆت:** کچ، قیز، کیژ [ف] دختر

٥٠ **پل:** پور [ف] عمه

٥٦ **پەسن:** تاریف، پێهەڵگوتن، چاکەگوتن [ف] ستودن، مورد پسند

٦٠ **ئاکام:** ١ ـ دوایی، پاشینە، دوماهی ٢ ـ کاتی مەرگ، هەنجەل، ئەجەل [ف] ١ ـ انجام ٢ ـ آجَل

٦٠ **هاوسا:** دراوسێ، جیران [ف] همسایه

## «سوڕەی سەبە ـ لاپەڕی ٤٢٨»

**سەبە: وڵاتێکی یەمەن [ف] سرزمینی در یمن**

١ **وەشانەوە:** ١ ـ شیان، ڕێک و ڕەوا ٢ ـ بەشینەوە، دابەش کردن [ف] ١ ـ شایان بودن ٢ ـ توزیع کردن

٣ **ڕابوُن:** هەستان، بەرزەوە بوُن (دێرەدا ڕوُدان و وەبەرچاوکەوتن مانا دەدات) [ف] بلند شدن

٤ **پاکژ:** ١ ـ پاوان، قەدەغە (مێرگ یا باغی تایبەتی، کەسێک نەتوانێ سەربەخۆ بیچێتێ) ٢ ـ خاوێن، تەمیز ٣ ـ تەرخانکراو [ف] ١ ـ قُرُق ٢ ـ پاکیزە ٣ ـ اختصاص

١٦ **دارسیواگ:** ئەو دارۆکەی بە تایبەت دەروێش و نوێژکەران ددانی پێ‌دەماڵن [ف] چوب مسواک

١٦ **کنار:** داری نەبگ [ف] درخت سدر

١٦ **نەبگ:** میوەی داری نەبگ کە لەگوێژەزەردە دەکاو درشت‌ترە [ف] میوۀ درخت سدر

٣٧ **سامان:** دارایی، دەوڵەت [ف] اموال و دارایی

٣٧ **ئۆدە:** ژوُر، وەتاغ، چاوەماڵ [ف] اتاق

٣٨ **دەربچن:** هەڵێن، ڕاکەن (مەبەس ئەوەیە کە خەڵاسیان بێ و رزگار بین) [ف] فرار کنند

٤٩ **باو:** ١ ـ ڕمێن و ڕەونەق ٢ ـ هەل و دەرفەت [ف] ١ ـ رونق ٢ ـ فرصت

## «سوڕەی فاتیر ـ لاپەڕی ٤٣٤»

**فاتیر: داهێنەر، خوڵقێنەر [ف] خلق‌کننده**

١٣ **دیاردە:** بەرچاو، دیار، ئاشکرا، خۆیا [ف] معین، آشکار

١٨ **چارەنوُس:** بەخت و هات [ف] سرنوشت

۲۹ **نهێنی:** نەهێنی، پەنامەکی، بەدزی‌یەوە [ف] سری، نهانی

۲۹ **برەو:** ڕەواج و ڕەونەق و ڕمێن [ف] رونق

۳۵ **لێرا:** لە ئەم شوێنە [ف] در اینجا

## «سوڕەی یاسین ـ لاپەڕی ۴۴۰»

**ی ، س: ی ، س**

۸ **داشۆریاگ:** داهێژراو لە سەرەوە بۆ خوار، داهێڵراو [ف] آویزان شدە (مەبەس چاو دانواندنە)

۱۳ **ئاوایی:** ئاوەدانی، ئاوانی (مەبەست شاری ئەنتاکییەی ڕۆمێ بوکە ئێستێ لە مەملەکەتی تورکییەی دایە و ئەو پیاوەش کە لە ئایەی ۲۰دا هێمای پێ کراوە دەڵێن حەبیبی نەججاڕ بوە) [ف] آبادی

۲۵ **بژنەون:** ببیسن، بژنەفن [ف] بشنوند

۲۵ **ژنەوین:** ژنەفتن، بیستن، بیسن [ف] شنیدن

۳۹ **پەل:** ۱ ـ لکی دار ۲ ـ دڕکی دار ۳ ـ لاق و دەست (لە چوار پەلان گوێی ساغە) [ف] ۱ ـ شاخە ۲ ـ خار درختی ۳ ـ هر یک از دست و پاها

۴۵ **ڕوبەڕو و پشتە سەر:** مەبەست سزای دنیایە و عەزابی پەسڵانێ [ف] روبەرو و پشت سر

۶۶ **ملە:** ۱ ـ ڕکە، کێبەرکێ ۲ ـ بستو، زینوێ [ف] ۱ ـ مسابقە ۲ ـ گردنۀ کوە

۶۶ **سۆما:** ۱ ـ ڕوناکی چاو، هێزی دیتن ۲ ـ ئاسۆ [ف] ۱ ـ سوی چشم ۲ ـ افُق

۶۶ **دین:** دیتن، چاو پێ کەوتن [ف] دیدن

۷۲ **دەستەمۆ:** ۱ ـ حەیوانێ کە ڕامی دەستی خاوەنی بێ و زو بگیرێ ۲ ـ کارەکەر [ف] ۱ ـ حیوان رام شدە ۲ ـ کلفت

۷۸ **پوان:** ڕزینی کاڵا [ف] پوسیدن کالا، پوسیدن

٨٠ **تۆخ:** تاریک ڕەنگ، سوُری ئاماڵ ڕەش [ف] رنگ سیر

٨٠ **ئار:** ئاگر، ئاور [ف] آتش

٨٠ **پێکردن:** هەڵ کردنی ئاگر و چرا [ف] روشن کردن آتش و چراغ

٨١ **وزە:** توانا، قەوەت، تاقەت [ف] توان

## «سوُڕەی سافقات ـ لاپەڕی ٤٤٦»

**سافقات:** ڕیزگرەکان، سەفگرەکان [ف] صفگیرندگان

١ **تەکوُز:** ڕێک‌وپێک، لەبار و بێ کەمایەسی [ف] دارای نظم و ترتیب

٥ **ڕۆژهەڵات:** خۆرهەلات، خاوەر [ف] مشرق

٨ **ڕاو نان:** شوێن کەوتن بۆگرتن، دانە دوُ، دانە پەی [ف] دنبالەکردن، تعقیب بە قصد گرفتن

١١ **پندر:** کزر، نیوە وشک، توندەوە بوُی شل [ف] نیم خشک

١١ **پێکەوە:** تێکڕا، دەگەڵ یەک، وێکڕا، وێڕا [ف] با هم

١١ **لکاو:** چەسپاو [ف] چسپیدە

١١ **گڵی پێکەوە لکاو:** گڵی پێکەوە چەسپاو [ف] گل سرشتە

١٩ **تێ ڕاخوڕین:** تێ خوڕین، لێ گوڕاندن، بە قەو دواندن، لێ گوڕاندن [ف] نهیب زدن، صیحە

٢٢ **لفی‌وان:** [ف] (همسران آن‌ها)

٢٢ **لف:** ١ ـ وەک، وێنەی، چوُن ٢ ـ ئاوەڵدوانە ٣ ـ پێچ، پێچدان [ف] ١ ـ همانند ٢ ـ همزاد، دوقلو ٣ ـ پیچ، پیچش

٤٦ **چەرمەگ:** سپی، گەور، چەرمگ [ف] سفید

٤٦ **گەور:** ١ ـ سپی ئاماڵ زەرد ٢ ـ ڕەنگی کەوە ٣ ـ ئاورپەرەست ٤ ـ گەنمڕەنگ، ئەسمەر ٥ ـ زل، مەزن [ف] ١ ـ سفید مایل بە زردی ٢ ـ توسی ٣ ـ آتش‌پرست، گبر، زرتشتی ٤ ـ گندمگون ٥ ـ بزرگ

**٤٨ حاند:** جێگەیەکی دیار [ف] جای مشخص

**٤٨ لە حاند:** لە ڕوی (لە بەرانبەر، لە حاست) [ف] در برابر

**٤٨ نامۆ:** بێگانە، غەریبە، غەوارە، بیانی [ف] بیگانه

**٦٦ دەماسێنن:** هەڵدەمسێنن [ف] منظور پر میسازند

**٦٦ ماسین:** ١ ـ هەڵمسان، پەنەمین، پەنەمان ٢ ـ توێژی مەیوی ڕۆن و چەوری بە سەر شتێکەوە [ف] ١ ـ آماسیدن ٢ ـ لایۀ چربی بر چیزی بسته شدن

**٦٨ گڕ:** دەورە [ف] پیرامون

**٦٨ گڕ خواردن:** بە دەورەدا سوڕ دانەوە [ف] پیرامون گشتن

**٦٨ گڕ دەخۆنەوە:** خول دەخۆنەوە (دوبارە دەگەڕێنەوە) [ف] منظور دوباره برمیگردند

**٨٦ لە بری:** لە باتی، لە جیاتی [ف] در عوض، به جای

**٩٠ تەکینەوە:** ١ ـ دوڕکەوتنەوە ٢ ـ کشانەوە لە کارێ [ف] ١ ـ دور شدن ٢ ـ شانه خالی کردن

**٩٣ تێسرەواندن:** دارکاری کردن، لێدان لە پڕ و نەکاو [ف] کتک کاری کردن

**٩٤ هەڵەداوان:** پەلەی زۆر [ف] شتابان

**٩٧ شوڕە:** ١ ـ وارش، سوڕ، شورا، دیواری ماڵ و باغ و حەسار ٢ ـ عار و نەنگ [ف] ١ ـ بارو، حصار ٢ ـ ننگ و عار

**١٠٣ ئەنی:** توێڵ، ناوچاوان، هەنیە [ف] پیشانی

**١٢٦ باڤ:** ١ ـ باب، باوک ٢ ـ ئاماڵ، نزیک لە ڕەنگا (زەرباڤ: ئاماڵ زەرد) [ف] ١ ـ پدر ٢ ـ متمایل بە...

**١٤٦ بڕکە:** پنجی بێستان (بڕکە کاڵەک) [ف] بوتۀ پالیزی

**١٥٣ بژاردن:** نەقاندن، هەڵبژاردن [ف] انتخاب کردن، برگزیدن

**١٥٨ دەهێنە بەرێ:** بانگیان دەکەن بۆ لێپرسین و جواب دانەوە [ف] احضار میکنند

**١٧١ بەرێش:** لە پێشوشدا [ف] از قبل هم

**١٧٧ سپێدەی ترسێنداوان:** (دەبێ مەبەس بەیاتێکی زۆر ناخۆش بێ) [ف] بامداد به وحشت آورندگان

## «سوڕەی ساد، لاپەڕی ٤٥٣»

ص: ص

١٠ **پەیژە:** نێردیوان [ف] نردبان

١٢ **نیخ:** بنی گەروُ، بنیقوڕگ [ف] بیخ گلو

١٢ **چوار نیخە:** چوار مێخە، چوار بزمار، ئشکێل، چوار پەل بەستن و بە عەرزا دان [ف] چهار میخ کشیدن

١٢ **چوار نیخە کێش:** چوار مێخە کێش، هەر چوار پەل بەسراو [ف] چهار پا بسته

١٥ **هەنیسک:** نزگەرەی بە گریانەوە، خیسک [ف] سکسکۀ گریه

٢١ **دادبەر:** گلیکار، شکایەتکەر، دادخوا [ف] شاکی، دادخواه

٢٣ **پەز:** ١ ـ مەڕ، یەک مەڕ ٢ ـ مێگەل لە مەڕ و بزن [ف] ١ ـ گوسفند ٢ ـ گلّه

٣١ **ڕەسەن:** نجیمزادە، بنەچە کە [ف] نژاد، نجیب، اصیل

٣٢ **ئەوین:** ئەڤین، ئەڤین، دڵداری [ف] عشق و علاقه

٣٨ **تۆق:** ئاڵقە، گەو، قەف [ف] حلقه

٤٢ **چای:** ١ ـ فێنک ٢ ـ سارد ٣ ـ دەرمان چا، تۆ چا، چا [ف] ١ ـ خنک ٢ ـ سرد ٣ ـ چای

٤٤ **قول:** ئەندازەی قامکی زل و قامکی شادە بە ئاڵقە وگەو [ف] دایرۀ بین انگشت بزرگ و شهادن

٤٤ **قول:** پڕ بە نیوان قامکی گەورە و قامکی شادە لە گیا و گۆڵ و... [ف] پُر به اندازۀ دایرۀ بین انگشت شهادت و انگشت بزرگ از گیاه و غیره

٤٤ **توُڵ:** شوُڵ، شوُ، لکی باریک [ف] ترکه

٤٤ **زراف:** باریک [ف] باریک

٤٤ **زڕاو:** تازە لک دەرکردک [ف] تازه جوانه زده

٤٤ **زراو:** ١ ـ زارە، کیسەی زەرداو ٢ ـ زافر، وێران [ف] ١ ـ زرداب ٢ ـ غیرت و شجاعت

٤٥ **یێرانە:** بیهێنە [ف] بیار

**٤٥ وەبیر بێرانەوە:** وەبیر بهێنەوە [ف] به یاد آر

**٥١ ڤەخارن:** ١ ـ شتی خواردنەوە ٢ ـ خواردنەوە، ڤەخاندن [ف] ١ نوشیدنی ٢ ـ نوشیدن

**٦٠ ڕەچاو:** بژاردنی یەکێ بۆکارێ [ف] زیر نظر گرفتن

**٦٠ ڕاچاوکرن:** هەڵبژاردن و دەبەرچاوگرتنی کەسێ یا شتێ بۆکارێک [ف] انتخاب کسی یا چیزی برای انجام کاری

**٦٠ ئەنوا:** پەنا و پەسیو، جێ حەوانەوەی شەو ٢ ـ شوێنی باران نەگر [ف] ١ ـ پناهگاه، جای آرمیدن شب ٢ ـ جایی که باران آن را نگیرد

**٦٣ کول:** ١ ـ چاوی بە ژان ٢ ـ تیخێ کە نابڕێ [ف] ١ ـ چشم بیمار ٢ ـ تیغ کند

**٦٤ کێشە:** ١ ـ دمەقاڵە، بناشت ٢ ـ شەڕ [ف] ١ ـ نزاع لفظی ٢ ـ نزاع و جنگ

**٦٦ کۆڵنەدەر:** ١ ـ نەبەز ٢ ـ شل و سست لە ڕاکردنا [ف] ١ ـ نستوه ٢ ـ ناتوان در دویدن

**٨٧ بیرەوەری:** ١ ـ یادکردنەوەی ساڵانی ڕابردوُ یا مردوُی گەورە ٢ ـ نوُسینەوەی ڕوُداو، یادداشت [ف] ١ ـ یادبود ٢ ـ یادداشت

## «سوُرەی زومەر ـ لاپەڕی ۴۵۸»

**زومەر:** پۆل پۆل، دەستە دەستە [ف] گروه گروه

**۵ دیاردە:** ١ ـ بەرچاو، دیار ٢ ـ تەماڵ، کروێشکی خۆ لە لاندا مەڵاس کردوُ [ف] ١ ـ آشکار ٢ ـ خرگوش در لانه خوابیده

**۵ کاتی دیاردە:** کاتی زاندراو و ئاشکرا [ف] وقت آشکار، وقت معیّن و معلوم (مەبەس ئەو سات و کاتەی کە بۆی داندراوە)

**٦ جار:** ١ ـ دحفە، هەل، کەڕەت ٢ ـ وەخت، کات [ف] ١ ـ دفعه ٢ ـ گاه

٦ **جار لە دوُجار:** لە هەر دەحفێکی‌دا دوُکەڕەتان [ف] در هر مورد دو بار

٦ **سێ قۆناغ:** مەبەس سێ پەردە، سێ توێ [ف] سه پرده که عبارتند از دیوارۀ رحم، لایۀ جفت و پردۀ آمونیوتیک

٦ **سێ قۆناغ:** [ف] منظور ١ ـ اِکتودرم ٢ ـ مزودرم ٣ ـ آندودرم

١٦ **وەستان:** ١ ـ ڕاگیران ٢ ـ پێش گرتن [ف] ١ ـ ایستادن ٢ ـ متوقف شدن

١٦ **داوێستاوە:** محەللەق ڕاگیراوە [ف] در هوا بدون حرکت ایستاده

٢٠ **ئۆدە:** ژوُر، وەتاغ، چاوەماڵ [ف] اتاق

٢٤ **چارە:** ١ ـ دەم و چاو، تەڕح و بیچم، ڕوُ ٢ ـ بەخت ٣ ـ دەرەتان [ف] ١ ـ سیما ٢ ـ شانش ٣ ـ چاره

٣٧ **کل:** ١ ـ لا دان (لە ڕێگە کل بوُە) ٢ ـ خوار، لار ٣ ـ سورمە ٤ ـ ڕەوانە [ف] ١ ـ انحراف ٢ ـ کج ٣ ـ سرمه ٤ ـ روانه، گسیل

٤٧ **بارتەقا:** هەمبەر، بەرانبەر، باتەقا(مەبەس دە سەرگەڕان و بەلاّگێڕ و دەپێناو نانە) [ف] مقابل

٥٣ **لێبوردە:** گوناەبەخش، گوناحبەخش [ف] عفوکننده

٥٣ **بەخشندە:** دلاّوا، سەغی، بە دڵ [ف] سخی

٥٦ **درێغی:** درێخی [ف] تقصیر، کوتاهی در کار

٦٣ **کلیل بە دەست:** بریتی لە خاوەن دەسەلاّت [ف]کنایه از همه کاره

٦٣ **کلیل گەل:** مەبەس زانینی هەموُ نهێنی و خۆیایان و خاوەن دەسەلاّتی هەموُ شتێ

٦٩ **دێنە بەرێ:** دێنە پێش [ف] احضار می‌شوند

٧١ **گزیر:** بەردەستی کوێخا لە دێ‌دا [ف] پادوی کدخدا در روستا

٧٤ **خەباتکار:** ١ ـ کارکەر ٢ ـ بە کۆششت (مەبەس چاکە کارانـن) [ف] ١ ـ مبارزه ٢ ـ کارگر (منظور نیکوکاران)

٧٤ **خەبات:** کار، کۆششت [ف] جهد و کوشش

# ‹سوڕەی غافیر ـ لاپەڕی ۴۶۷›

**غافیر: لە تاوان دەبوڕێ، بەخشین، عافوٚ کردن [ف] از گناه در گذشتن، عفو کردن**

٤ **گەڕ:** ١ ـ فێڵ و گزی ٢ ـ تەشقەڵە، شڵتاغ [ف] ١ ـ حیله ٢ ـ شلتاق

٤ **خولیان:** خەیاڵات، ئاواتی پڕوپوٚچ [ف] آرزوهای مهمل

٤ **گەڕ و خولیان:** سوڕانەوە و گەڕانیان [ف] رفتن و گردش و گردیدن

٨ **وڵف:** جوٚت [ف] همسر، جفت

٨ **هاولف:** هاوجوٚت، ژنی حەڵاڵ [ف] کنایه از همسر

٨ **هاولف:** ١ ـ ئاواڵدوانە ٢ ـ هاواڵ [ف] ١ ـ دوقلو ٢ ـ دوست

٨ **بەرە و توٚرەمە:** تایفە و بنەچەکە، تیرە و ڕەچەڵەک [ف] طایفه و نژاد

١١ **دوٚجار:** مەبەست ئەوەیە کە خوا هەوەڵێ خاک و گڵی سازکرد و ژیانی پێبەخشی و هێنایە هەرێمی ژیان و لە پاش مەرگ دیسان ژیانی یەکجاری پێ دەبەخشێ

١١ **دوٚجار:** ژیانی سەر عەرز و قیامەتی [ف] منظور زندگی دنیوی و روز رستاخیز

١٤ **دین:** ١ ـ خواپەرسی ٢ ـ لێوە، شێت ٣ ـ زان، مناڵ بوٚن [ف] ١ ـ آیین ٢ ـ دیوانه ٣ ـ زاییدن

١٥ **پلە:** دەرەجە و پایە [ف] مقام

١٥ **تایبەت:** تاویەتی، خوسوسی [ف] ویژه

١٨ **قوڕگ:** ژوٚرەوەی ئەستوٚ لە پێشەوە، گەرو [ف] گلو

١٨ **پیش:** ١ ـ هەناسە، نەفەس ٢ ـ پوٚش، وشکە گیا [ف] ١ ـ نَفَس، دَم ٢ ـ گیاه خشک

٢٢ **چاخ:** وەخت و زەمان، کات [ف] وقت

٣٤ **دەسا:** ١ ـ جاکە وایە ٢ ـ دە ئێتر [ف] ١ ـ پس ٢ ـ پس دیگر

٣٦ **ئاسوٚ:** کەنارەی ئاسمان، قەراغی ئاسمان، تارمایی [ف] اُفق، سایەای در تاریکی

٣٧ **گەند:** ١ ـ کاری کرێت ٢ ـ خراپ و بێنرخ ٣ ـ گەن، بوٚن ناخوٚش ٤ ـ ڕزین لە تەڕاییدا [ف] ١ ـ کار زشت ٢ ـ بُنجُل و بی‌ارزش ٣ ـ بدبو ٤ ـ پوسیدن از خیسی

٤٨ **لەخوٚبایی:** بادی هەوا، بە فیز و دەعیە و لەخوٚ دەرچوٚ، بایی بوٚن [ف] مغرور شدن، متکبر

٥٣ **کەلەپوور:** جێ ماگ لە مردگ [ف] ارث

٥٤ **بیرەوەری:** یادداشت، نووسینەوەی ڕوداو [ف] یادبود

٥٧ **داهێنان:** ١ ـ لە نوێ هێنان ٢ ـ ڕام کردن، کەوی کردن [ف] ١ ـ اختراع ٢ ـ اهلی کردن

٦٤ **بیچم:** ١ ـ شکڵ و هەندام ٢ ـ تەرح و دیدار ٣ ـ تەرز و شێوە، جۆر [ف] ١ ـ هیئت ٢ ـ سر و سیما ٣ ـ شیوه

٦٧ **بە خۆدا هاتن:** گەشە کردن، هەڵدان [ف] شکوفا شدن

٦٧ **ڕامان:** ١ ـ دەبیرەوە چوون، مات بوون و بیر کردنەوە ٢ ـ سەرسوڕمان [ف] در فکر فرو رفتن ٢ ـ متحیّر ماندن

٧٠ **زۆر ناخایەنێ:** زۆر پێ ناچێ [ف] طول نمی‌کشد

٧٥ **ناڕەوا:** ناحەق، نابەجێ [ف] ناروا

٧٧ **سا بوێستە:** کەوابۆ سەبرت بێ [ف] پس صبر کن

## «سوورەی فوسسیلەت ـ لاپەڕەی ٤٧٧»

**فوسسیلەت: شی کراوە بە ڕوونی [ف] شرح و تفسیر مبین**

٣ **شی‌کراوە:** ١ ـ شی کراو، هەلاجی، لەبەر یەک هەڵوەشاوی لۆکە و خوری و موو ٢ ـ بەریتی لە تاقیق کراو و لێ کۆڵراوە [ف] ١ ـ پنبه یا پشم زده شده ٢ـ کنایه از پژوهش شده، توضیح داده شده

٦ **واوەیلا:** وای بە حاڵیان، وای بە حاڵتان [ف] وای به حالتان

١٠ **پیت:** بەرەکەت و فەر [ف] یمن و برکت

١٦ **ڕەشەبا:** بای توندی ڕۆژاوا [ف] باد دبور

١٦ **ڕۆژانی شووم:** ڕۆژانی بێ‌فەڕ (کە ئەو بایانە هەشت ڕۆژ و حەوت شەوان بە دووی یەک‌دا دێن) [ف] روزهای بدیُمن (که این بادها هشت روز و هفت شب پی‌درپی می‌وزند)

۱۷ **شان دان:** نیشان دان، خستنه بەر چاو [ف] نشان دادن

۱۹ **نەیار:** دوژمن [ف] دشمن

۲۰ **دژ:** ۱ ـ پێچەوانه ۲ ـ ڕوُترش [ف] ۱ ـ مخالف ۲ ـ اخمو

۲۵ **خەمڵاندن:** ڕازاندنەوه به خشڵ و جلکی جوان، جوان کردن [ف] آراستن

۲۹ **گلا:** گش لا، هەموُ لایەک [ف] همگی، همه جانب

٤٥ **گفت دان:** بەڵێن دان، پەیمان دان (دەبێ مەبەس له ما کی کتێب لەوحی مەحفوُز بێ که بڕیاری یەکجاری لەودا دەرچوُه) [ف] پیمان دادن

٤٧ **درکاندن:** ڕاستی گوتن، ئاشکرا کردنی قسه، درکانن [ف] اعتراف کردن

۵۳ **هاکا:** ۱ ـ بەم جۆره، بەو تەرزه ۲ ـ بەو نزیکانه، زۆری نەماوه [ف] ۱ ـ این طور، چنین ۲ ـ نزدیک است، چیزی نمانده

## «سوُرەی شوّرا ـ لاپەڕی ۴۷۷»

**شوّرا: ڕاوێژ، تەگبیر [ف] شورا، تدبیر**

۵ **دەرز:** ۱ ـ قەڵشتی باریک، درز ۲ ـ دەرس، وانه [ف] ۱ ـ درز ۲ ـ درس

۵ **خرمه:** ۱ ـ دەنگی وێک‌کەوتنی خشڵان ۲ ـ دەنگی کرۆژتن [ف] ۱ ـ صدای به هم خوردن زیورآلات ۲ ـ صدای کروچیدن

۸ **بەره:** ۱ ـ تیره، تایفه [ف] عشیره

۱۱ **بەرهەم هێنان:** پێ گەیاندن، بەخێو کردن، ڕەنێوهێنان [ف] به نتیجه رسانیدن

۱۱ **پەره:** برەو، ڕەواج، ڕەونەق (مەبەس زۆر بوُنه) [ف] رونق

۱۳ **ئەسپاردن:** سفارشت، ڕاسپاردن، قەوینتی کردن [ف] سفارش

۱۳ **چەند بەرەکی:** چەند دەستەیی [ف] چند دستەای

١٣ **بژارتن:** پاک کردنی دانەوێڵە لە زیوان و شتی ناباب [ف] پاک کردن غلّات

١٣ **بژاردن:** چاک لە خەراپ جیاکردنەوە، نەقاندن [ف] برگزیدن

١٣ **دەیبژێرێ:** هەڵیدەبژێرێ [ف] برمی‌گزیند

٢٤ **ئارا:** ١ ـ وجوُد و بوُن ٢ ـ جێگەی ژینی هەمیشەیی ٣ ـ دۆستی و نێوان خۆشی [ف] ١ ـ وجود داشتن ٢ ـ محل ثابت زندگی ٣ ـ دوستی

٢٧ **سەروبەر:** ١ ـ بە تەواوی، تەواو ٢ ـ سازی و ئاسوُدەیی لە ژیاندا [ف] ١ ـ کاملاً بدون نقص ٢ ـ سر و سامان

٢٧ **بێ سەروبەر:** (مەبەس زیاد لە پێویست، زیاد لە ئەندازە) [ف] زیاد از اندازه

٢٧ **بێ سەروبەر:** حاڵ شڕ و لێ‌قەوماو، نەدار و هەژار و پەک‌کەوتە [ف] بدحال و پریشان

٣٢ **چیا ئاسا:** وەک کێوی [ف] مانند کوه

٣٢ **قەتیس:** ١ ـ قەتیز، بێ دەرەتان، گیر کردن ٢ ـ داماو ٣ ـ هەڵتۆقیو [ف] ١ ـ گیر کرده ٢ ـ درمانده ٣ ـ برآمده

٣٦ **پێز:** ١ ـ کێش و هێز ٢ ـ ماک و ڕەگەز ٣ ـ مەڕ، پەز (مەبەس چاکتر و بادەوامتر و دایمە ماو باقی دەمێنێتەوە) [ف] ١ ـ کش و تاب ٢ ـ اصل و ماده ٣ ـ گوسفند

٤٨ **بواردن:** ١ ـ لی‌هەڵبواردن ٢ ـ بگاردن [ف] ١ ـ اِهمال ٢ ـ گذشتن

٥١ **قاسید:** مرۆی ڕەوانە کراو بۆ کارێک [ف] قاصد، نامەبر، پیک

٥٢ **مەشخەڵ:** مەخشەڵ

٥٢ **مەخشەڵ:** ١ ـ گڕی بەرزی ئاگر ٢ ـ داری سەر بە گڕی ئاگر (مەبەس نوُر و ڕوُناکی و چرایە) [ف] ١ ـ زبانه بلند آتش ٢ ـ مشعل

## «سوُرەی زوخروف ـ لاپەڕی ٤٨٩»

**زوخروف: شتی هەموُ ڕەنگە یا شتی هەمە ڕەنگە (مەبەست زێڕ و زێو و کەرەستەی جوان کردن) [ف] اشیائی از همه رنگ**

١١ **مری:** مردوُ [ف] مرده

١١ **بوژانەوە:** وەکەیف کەوتن لە پاش لەڕی و کەساسی [ف] انتعاش، به نشاط آمدن

١٢ **ئەم:** ئەو، هێما بۆ نزیک، ئەڤ [ف] این، اشاره به نزدیک

١٢ **جفت:** شوو بۆ ژن و ژن بۆ شوو، همسر (مەبەس هەموو زیندەوەرێک و گیا و گوڵیش) [ف] همسر

١٧ **ڕک:** ڕق، توڕەیی، قین [ف] خشم

١٨ **خشڵ:** زێڕ و زەنبەر [ف] زیور

١٨ **نەخۆیا بێ:** نادیار بێ [ف] هویدا نباشد

١٨ **بۆ خوا دەبێ:** (مەبەس ئەوەیە کە بۆ خودای دەبێ یا خودا بۆ خۆی قەبوڵ دەکا و پێی ڕازی دەبێ)

٢٢ **بەڵکە:** بەشکوو، شایەتا، بەشکا [ف] شاید

٣٩ **داد:** ١ ـ هاوار ٢ ـ حوکمی ڕەوا، عەداڵەت [ف] ١ ـ فغان، فریاد ٢ ـ عدالت

٣٩ **داد و نادا:** ١ ـ دە فریاو نایە، دە فریاو ناگا، دە هاناو نایە (مەبەس ئەوەیە کە تازە ئەو قسانە و پەشیمان بوونەوەتان هیچ بەهرە و قازانجێکی بۆ ئێوە تێدا نیە) [ف] به فریاد نمی‌رسد

٤٠ **گوێ کپ:** کەڕ [ف] ناشنوا

٤٣ **پێداگرتن:** سوور بوون لە سەر مەبەست [ف] اصرار ورزیدن

٤٧ **تریقە:** دەنگی بەرزی خەنین، حیلکە [ف] قهقهه

٥٣ **گەو:** ئاڵقە، بازنە، موچەوانە [ف] حلقه

٥٤ **سفک:** سووک، دژی گران و سەنگین، سفک (مەبەس ژێردەستەکانی لە کاری هیچ و پووچ و نارەوا خۆشیان دێ) [ف] سُبک

٦٥ **توش:** ناخۆش [ف] دردناک

٧٥ **وچان:** ١ ـ پشوو دان، ئیستراحەت ٢ ـ موڵەت [ف] ١ ـ استراحت ٢ ـ مُهلت

٧٧ **چەرمەسەر:** دەرد و ئازار و ڕەنجی زۆر [ف] رنج و مشقت بسیار

٨٢ **عەرش:** تەختی خوا لە عاسمانان [ف] عرش خدا

## «سوُڕەی دوُخان ـ لاپەڕی ۴۹۶»

**دوُخان: دوُکەڵ [ف] دود**

۸ **بوُنەوەر:** گیاندار [ف] جاندار، ذی‌روح

۱۲ **پەتا:** ئازار [ف] آزار

۳۷ **باشوُر:** باشوُر، لای قوبلە، نێوان خۆرهەڵات و رۆژاوا، بەرانبەر بە باکوُر [ف] جنوب

٤۰ **ژوان:** پێک گەیشتن لە جێگەیەکی دیاری [ف] به هم رسیدن در جای مشخص

٤٥ **سک:** ۱ ـ زگ، ورگ و ناو ۲ ـ پیزە، تۆڵ [ف] ۱ ـ شکم ۲ ـ جنین

٥٤ **کەژاڵ:** ۱ ـ چاوکاڵ ۲ ـ ئاسک ۳ ـ بزنەکێوی [ف] ۱ ـ چشم مایل به آبی ۲ ـ آهو ۳ ـ بزکوهی

٥٤ **سۆڵ:** زۆر سپی [ف] خیلی سفید

## «سوُڕەی جاسییە ـ لاپەڕی ۴۹۹»

**جاسییە: بە سەر چۆک داهاتۆکان [ف] روی زانو نشسته‌ها یا خم‌شده‌ها**

۱۲ **گوێرە:** گۆرە، بەرانبەر بە [ف] بر طبق

۲۰ **سۆما:** ڕوُناکی چاو، هێزی دیتن [ف] نیروی دید

۲۲ **چەی:** چی، چشتێک [ف] چه، چه چیزی

۲٤ **سروُشت:** سرشت، خۆکرد، خۆڕست [ف] طبیعت

۲٦ **ژین:** زینگی، ژیان، ژی [ف] زندگی

۲٦ **ژیو:** زیندوُ [ف] زنده

۲٦ **ژیو ـ ژی + و:** ژیو، زینگیو [ف] زندگی

٢٨ **سیایی:** سیاهە، نوُسینی حیساب و ناو لە قاقەز، لیستە [ف] سیاهە، لیست

٣٢ **قنیات:** سەبوُری [ف] شکیبایی

٣٧ **شکۆ:** پایەبەرزی، گەورەیی، جەلال [ف] عظمت، شکوه

## «سوُرەی ئەحقاف ـ لاپەڕی ٥٠٢»

**ئەحقاف: جێگایەکە لە یەمەن [ف] مکانی در یمن**

٣ **وەبەر بێرن:** وەبەر بێنن [ف] از آن داده شوند (منظور از آن چه از آن بیم داده می‌شوند)

٣ **بێرن:** بێنن [ف] بیاورند

٩ **ئاسا:** وەکوُ [ف] مانند

٩ **نائاسا:** ناشناس [ف] نامعلوم

١٠ **یەک لە تۆرەمەی ئیسرائیل:** مەبەست یەکێک لە زانا و بلیمەتەکانی جوُلەکان بە نێوی عەولاّ کوڕی سەلام کە لە دوایەدا لە بازێڕی مەدینە ئیمانی هێنا [ف] یکی از نژاد اسرائیل

١٤ **قەرەبوُ:** بژاردنەوەی زەرەر (مەبەس کردەوکانیان چ چاک چ خەراپ) [ف] تلافی، جبران

٢٤ **شیو:** دۆڵی تەنگ [ف] دره تنگ

٣٠ **ناوەرۆک:** هەر چی دەناو شتی تر دایە [ف] محتوا

٣٠ **هانە:** دنە، هان [ف] تحریک

٣٢ **ئاوا بن:** ئاو جوُرە بن [ف] چنین باشند

٣٤ **ڕانان:** بەرچاوی حەشامەت دان [ف] بە نمایش گذاشتن

## «سوڕەی موحەممەد ـ لاپەڕی ٥٠٧»

**موحەممەد: دوایین پێغەمبەران [ف] آخرین پیامبران**

٤ **فیڕۆ:** بە هیچێ چوُ، خۆڕایی لە دەس چوُ [ف] هدر

٨ **نەگبەت:** ١ ـ بەدبەخت، چارەڕەش ٢ ـ بەڵا، چۆرتم [ف] ١ ـ سیەروز ٢ ـ مصیبت

١٥ **لنگ:** ١ ـ بەرانبەر، تا، وەک ٢ ـ لنگە ٣ ـ لاق، پا، قاچ [ف] ١ ـ لنگ، همتا ٢ ـ لنگە ٣ ـ پا

١٦ **دەر دەچن:** ١ ـ بۆ دەرەوە ڕۆیشتن ٢ ـ لە ئەزموُن سەرکەوتن ٣ ـ هەڵاتن، ڕایان کرد [ف] ١ ـ بیرون رفتند ٢ ـ در آزمایش موفّق شدند ٣ ـ در رفتند، فرار کردند

١٩ **هەڵگێڕ وەرگێڕ:** ژێر و ڕوُکردن (بریتی لە جوُڵانەوە و هاتوُچۆ) [ف] زیر و رو کردن (کنایه از جنبش و تحرّک و رفت و آمد)

٢٠ **فێدار:** خوُدار [ف] صرعی

٢٢ **ڕێوە دەبەن:** ١ ـ دەکەن ٢ ـ دەکەنە پیشەی خۆتان [ف] ١ ـ می‌کنید ٢ ـ روش خود می‌کنید

٢٢ **بەڕێوە بردن:** ئیدارە کردن، پێچاران [ف] اداره کردن

٢٢ **چڕین:** ١ ـ پچڕین، پساندن ٢ ـ گوتن، گوتنی گۆرانی [ف] ١ ـ گسستن ٢ ـ آواز خواندن

٢٧ **سرەواندن:** ١ ـ ئارام کردن ٢ ـ تێ‌سرەواندن، لێدان [ف] ١ ـ آرام کردن ٢ ـ زدن

٢٧ **تێ سرەواندن:** ١ ـ دارکاری کردن ٢ ـ لێدان لە پڕ و نەکاو [ف] ١ ـ زدن با چوب ٢ ـ یهو زدن

٣١ **بەراورد:** ١ ـ لێکدانەوە، تاقی کردنەوە ٢ ـ تەخمین، بە خەیاڵ هەڵسەنگاندن، نرخاندن [ف] ١ ـ آزمودن ٢ ـ حدس و تخمین

٣٢ **پوُچەڵ:** بێ نرخ و بێ بەهرە، پوُچەک [ف] بی‌ارزش

٣٦ **خوازتن:** ١ ـ داوا کردن ٢ ـ ئارەزوُ کردن [ف] ١ ـ طلب کردن ٢ ـ آرزو کردن

٣٧ **قێرسیچم:** ١ ـ پێ‌چەقین، نەساز ٢ ـ ڕەزیل، ژرد [ف] ١ ـ لجباز ٢ ـ خسیس (منظور اصرار و پافشاری است)

٣٧ **ڕژدی:** سەقیلی، چروُکی، چکوُسی، چکوُدی [ف] بُخل و خست

## «سوڕەی فەتح ـ لاپەڕی ٥١١»

**فەتح:** سەرکەتن، سەرکەوتن [ف] فتح، پیروزی

٦ **ڕوبینی:** ١ ـ مەرایی، ماستاو سارد کردنەوە ٢ ـ تارا لە سەر بوک هەڵدانەوە [ف] ١ ـ ریایی ٢ ـ روبند برداشتن از سر عروس

١٠ **دەستی خودا دەسەر دەستی ئەوان ڕایە:** مەبەس ئەوەیە کە پەیمان و قەول و بەڵێنی خوا و پێغەمبەرەکەی لەوکەسانەی کە لە حودیبیەیە (حدیبیە) پەیمانیان دەگەڵ پێغەمبەر بەست پتەوتر و قایمترە

١١ **ئێوە با:** ئێوە بدا [ف] بە شما برساند

١٦ **خۆ بە دەستەوە دەدەن:** تەسلیم دەبن (دێنە سەر دینی ئێوە) [ف] تسلیم می‌شوند

٢٤ **ئاقار:** ١ ـ شوێن و جێگە ٢ ـ دەور و بەر ٣ ـ مەڵبەند و ناوچە [ف] ١ ـ جای ٢ ـ پیرامون ٣ ـ منطقە

٢٥ **گل:** ١ ـ جوڵە، بزاو ٢ ـ خلۆر [ف] ١ ـ حرکت ٢ ـ غلت

٢٥ **گل دانەوە:** لای خۆ هێشتنەوە [ف] نزد خود نگە داشتن

٢٥ **گلیان دابۆوە:** لای خۆیان هێشتبۆوە (ئاژەڵی قوربانی کە بەرەو مەککە دەڕۆیشتن گەڕاندبوویانەوە) [ف] نزد خود نگە داشتە بودند

٢٥ **موشکولۆزمە:** مشکولۆزمە، ئۆباڵ بە گەردن [ف] مدیون اخلاقی و آیینی، مشغوالذمە

٢٩ **درۆشم:** نیشانەی تایبەتی [ف] آرام، علامت فارقە

٢٩ **شبی:** ١ ـ وەکو، لە ڕەنگی [ف] همانند

٢٩ **شێنراو:** تەشبی کراو [ف] تشبیە شدە

٢٩ **وەچ:** ١ ـ لکی لە لق دەرچوگ ٢ ـ بێچو ٣ ـ نەوە و نەتیژە [ف] ١ ـ جوانە از نشا و شاخە ٢ ـ بچە ٣ ـ نبیرگان

٢٩ **ستوور:** ١ ـ ئەستوور ٢ ـ قەوی [ف] ١ ـ کلفت ٢ ـ ستبر

## «سوُڕەی حوجورات ـ لاپەڕی ٥١٥»

**حوجورات: هۆدەکان [ف] اتاق‌ها**

٤ **هۆدە:** ژوُری ماڵ [ف] اتاق

٧ **ئەڤین:** دڵداری، عیشق، خۆشەویستی دڵبەر، حەز لێکەری، حەز لێکردوُیی [ف] عشق

١١ **ناتۆرە:** لەقەمی ناپەسند [ف] لقب زشت

١٢ **قێز:** ١ ـ بێز، دڵ تێک‌چوُن لە دیتنی شتێ [ف] دل به هم آمدن از دیدن چیزی

١٤ **خۆمان بە دەستەوە داوە:** تەسلیم بوُین [ف] تسلیم شده‌ایم

١٤ **هێمان:** ١ ـ هێشتان ٢ ـ خۆمان [ف] ١ ـ هنوز ٢ ـ خودمان

## «سوُڕەی قاف ـ لاپەڕی ٥١٨»

**قاف: ق**

٥ **ئاڵۆز:** ١ ـ تێک‌هاڵاو (بەنەکە ئاڵۆز بوُە) ٢ ـ نەسازاوی، توُش و توُڕە ٣ ـ پشێوی و ئاژاوە [ف] ١ ـ سر درگم ٢ ـ آدم ناهنجار و بد عُنُق ٣ ـ آشوب و بلوا

٧ **کێوپارە:** پارچە کێو، لەتە کێو [ف] پارچه چیا

١٠ **هۆشە:** هێشوُ [ف] خوشه‌ی میوه، خوشه‌ی غله

١٢ **خودان:** ١ ـ خێو، خاوەن، ساحێب ٢ ـ خودا [ف] ١ ـ صاحب ٢ ـ خدا، اللّه

١٨ **چاوەدێر:** چاو لە شتێ بۆ ئاگا لێ بوُن [ف] ناظر

١٩ **بوُرانەوە:** ١ ـ دڵ لە خۆ چوُن، لە سەر خۆ چوُن [ف] از حال رفتن

٢٢ **هەواڵ:** ١ ـ خەبەر ٢ ـ ئاواڵ، دۆست [ف] ١ ـ خبر ٢ ـ رفیق

٢٢ **سەرپۆشمان لە سەر لادای:** بریتی لەوەیە کە پەردەی بێخەبەری و نائاگاییمان لە سەر لادای

٢٢ **بڕ:** تابشت و هێز (مەبەس هێزی دیتنی زۆرە) [ف] توان

٣٢ **سۆز دراوە:** قەول دراوە [ف] قول دادە شدە

٣٦ **ڕەخسا:** بە هەڵکەوت بۆی پەیدا بوُ، جۆر هات [ف] اتّفاقی جور شد

٣٨ **ماندگ:** ماندک، شە کەت، ماندوُ [ف] خستە

## «سوُڕەی زاریات ـ لاپەڕی ٥٢٠»

**زاریات: بایانی بڵاو کەرەوە [ف] بادهایی کە پخش می‌کنند**

٩ **تەکانەوە:** لیّ دوُر کەوتنەوە، دوُرەپەرێزی کردن [ف] دوری جستن

٤٢ **پێشە:** ئێسک، ئیسقان، هەستی [ف] استخوان

٤٢ **پواو:** ڕزیو [ف] پودە

٤٧ **پەرە:** برەو، ڕەواج [ف] رواج

## «سوُڕەی توُر ـ لاپەڕی ٥٢٣»

**تور: کێوی توُر [ف] کوە طور**

٥ **بان:** ١ ـ لای سەرو (مەبەس ئاسمانە) ٢ ـ سەر بانی خانوُ ٣ ـ بانگی نوێژ [ف] ١ ـ طرف بالا ٢ ـ بام ٣ ـ اذان

٩ **تێکەوەدان:** بە نارێکی و پەرێشانی هاتن و چوُن [ف] پریشان قدم زدن

٢١ **بارمتە:** گرۆ، گرێو [ف] گروگان

٢٧ **گڕ و هاڵاو:** تین و گەرمایی بڵێسەی ئاگر کە زۆر بە تەوژم و بیّ ئەمانە [ف] صدای آتش مشتعل

٣٠ **بوێژ:** شایەر، قسیە کەر، گۆرانیبێژ [ف] شاعر

٣٨ **پەیژە:** ناردیوان، پەیجە، نێردوان [ف] نردبان

٤٠ **مزە:** کرێ [ف] مزد، اجر

٤٠ **بۆیان زۆرگران بوەستێ:** (مەبەس بۆیان زۆرگران تەواو بێ) [ف] برایشان گران تمام شود

٤٤ **هەورێکی پڕ پشتە:** (مەبەس هەورێکی ئەستوُر و کولۆفت و پان و بەرین و هەراوە کە وڵاتێکی زۆر دەبەرخۆ دەگرێ) [ف] ابر استراتوس، منظور ابر متراکم، ابر ضخیم، ابر کلفت

٤٤ **پڕپشتە:** ئەستوُر و بەرینە [ف] متراکم، کلفت و پهن

٤٨ **تۆ بە بەرچاوی ئێمەوەی:** تۆ خۆت ژێر نەزەر و بیر و بڕوای ئێمە دای و بۆخۆن ئاگان لێتە [ف] تو منظور نظر مایی

## (سوُڕەی نەجم ـ لاپەڕی ٥٢٦)

**نەجم:** ئەستێرە، هەسارە [ف] ستارە

٩ **کەوان:** ١ ـ کەمان ٢ ـ ئامرازی خورَی و لۆکە شی کردنەوە [ف] ١ ـ کەمان ٢ ـ کمان پنبەزنی

١٣ **داپەڕین:** سەر بەرە ژێر بەلەز چوُن [ف] با شتاب فرو آمدن

١٥ **پاڵ:** ١ ـ تەنشت ٢ ـ ئەندەروُن ٣ ـ پشت [ف] ١ ـ جانب ٢ ـ درون ٣ ـ پُشت

٤٣ **خەنین:** کەن، کەنین، پێخەنین [ف] خندیدن

٤٨ **ناگوزوری:** فەقیری، دەس تەنگی [ف] بینوایی، تنگدستیَ

٤٩ **گەلاوێژ:** ئەستێرەیە کی زۆرگەشە لە نیوەی هاوینڕا دەبیندرێ [ف] ستارۀ شعرا

٥٠ **ئاسەوار:** ١ ـ شوێنەواری کەون ٢ ـ پاشماوەی ڕەچەڵەک (هەی ئاسەوارتان بیڕێ) [ف] ١ ـ آثار ٢ ـ نسل، نژاد

٥٣ **ئاوایی:** ئاوانی، ئاوەدانی [ف] آبادی

## «سوڕەی قەمەر ـ لاپەڕی ٥٢٨»

**قەمەر: مانگ [ف] ماه**

٨ **چەتوُن:** ١ ـ زەحمەت، چەتن ٢ ـ ناڕاست و توُش [ف] ١ ـ دشوار ٢ ـ ناهنجار و صعب

٢٧ **سایە:** وشتری نارەسەن [ف] شتر نااصل

٢٧ **ئەزموُن:** تاقی کردنەوە، ئینتیحام، جڕباندن [ف] آزمودن

٢٩ **پەل:** ١ ـ لاق و دەست ٢ ـ شەپۆل ٣ ـ بەرانبەری قوُڵ [ف] ١ ـ هر یک از دست و پاها ٢ ـ موج ٣ ـ مقابل ژرف

٣١ **پاچڤە:** وەرگێڕان، تەرجەمە [ف] ترجمه

٣٤ **زیخ:** خیز، وردە بەردی بەر چەم [ف] شن، سنگ‌ریزه

٣٤ **چەو:** ١ ـ وردکە بەرد، زیخ، خیز ٢ ـ چاو [ف] ١ ـ شن، سنگ‌ریزه ٢ ـ چشم

٣٦ **زەبر:** ١ ـ لێدان، لێخستن ٢ ـ بە نهێم داگرتن ٣ ـ توانایی، تاقەت [ف] ١ ـ ضربت ٢ ـ فشار ٣ ـ قوّت و توان (قهر و مؤاخذه)

٤٦ **بار:** تاوان و قەرەبوُ [ف] تاوان

٤٨ **گڵپە:** کڵپە، گڕی لە پڕ ٢ ـ دەنگی گڕگرتنی ئاگر [ف] ١ ـ شعله یکهو پدید آمده ٢ ـ صدای لهیب آتش

٥٥ **خۆنکار:** پاتشای گەورە [ف] فرمانروای بزرگ

## «سوڕەی ڕەحمان ـ لاپەڕی ٥٣١»

**ڕەحمان: خودای بە ڕەحمەت، خوای دەهندە، خوای دڵاوا [ف] خدای بخشنده**

٦ **ساقەتە:** کۆتەرەی دار [ف] تنۀ درخت، ساقۀ گیاه

١٧ **شوێن:** ١ ـ جێگا ٢ ـ شوێپ [ف] ١ ـ جای ٢ ـ اثر

٢٤ **گەڕۆکانی بە بادەوەی چیا ئاسا:** [ف] کشتی‌های بادبانی کوه مانند

٤٢ **ئەنەون:** [ف] بگیرند

٥٤ **ئاسەر:** ئاستەر [ف] آستر

٦٤ **ڕواڵەت:** دیمەن، ئەوی لەبەر چاوە [ف] ظاهر، ظاهری

## «سوڕەی واقیعە ـ لاپەڕی ٥٣٤»

**واقیعە: ڕوداو [ف] رویداد**

٣ **نزم:** نەوی، نەڤی، پێچەوانەی بڵند [ف] پست، کم ارتفاع

٥ **هاڕین:** ورد کردن وەک ئارد [ف] آرد کردن

١٨ **زەرک:** تاسی مسی بچوک [ف] طاس مسین

١٩ **خومار:** کەسێ کە دوای سەرخۆشی دێتەوە سەرەخۆ [ف] خُمار

٢١ **مەل:** ١ ـ پەڕندە، باڵدار، تەیر ٢ ـ جانەوەری بچکۆڵە (مەل و موور) [ف] ١ ـ پرندە ٢ ـ جانور ریز

٢٣ **مراری:** لولو، دوڕ [ف] مروارید

٢٣ **قاپۆر:** قابڵۆخ [ف] پوکە

٢٨ **چقڵ:** دڕک، دڕی، دڕو [ف] خار

٤٨ **کاڵ:** ١ ـ باپیر ٢ ـ پیاوی پیر [ف] ١ ـ نیا ٢ ـ سالخوردە

٨٩ **دەسێتەوە:** دەحەسێتەوە [ف] خستگی در می‌کند

## «سوڕەی حەدید ـ لاپەڕی ٥٣٧»

**حەدید:** ئاسن [ف] آهن

١١ **وام:** قەرز [ف] وام

١١ **قات:** ١ ـ لە ئەندازە، ئەوەندە، بەرانبەر (دوُ قات چاکەی دامەوە) ٢ ـ نهوم ٣ ـ کات، دەم، سات (ئەو قاتە لاو بوُم) [ف] ١ ـ برابر در اندازه ٢ ـ طبقۀ ساختمان ٣ ـ هنگام

١٢ **تیشک دانەوەی کردەیان:** تیشک دانەوەی کار و کردەیان [ف] بازتاب و عکس‌العمل رفتارشان

١٣ **لا:** ڕەخ، ئالی، قەراخ، تەرەف [ف] طرف، سمت

١٥ **سەرانە:** پیتاک لە هەر تاکێ لە مرۆ و ئاژەڵ [ف] سرانە، پیتاک، فدیە

١٥ **چارەنوُس:** بەخت و هات [ف] سرنوشت

٢٥ **بڕشت:** هێزی بڕین [ف] نیروی بُرش

٢٨ **تیرێژ:** تیشک، ڕوُناکی خۆر [ف] نور خورشید

## «سوڕەی موجادیلە ـ لاپەڕی ٥٤٢»

**موجادیلە: پیلە، کێشە، بەهانە، گەڕ و تەشقەڵە [ف] کشمکش، بهانە**

١ **ئەو ژنە:** مەبەست حەولە ژنی ئوُس بنی سامتی بوُ کە ئوُس سوێندی لێخواردبوُ و گوتبوُی لەوەی‌واوە تۆ وەک دایکمی [ف] آن زن

٥ **ناچاری:** مەجبوُری، کەسێ کە دەسەڵاتی کاری بە خۆی نەبێ [ف] ناگزیری

٥ **دوچاری ناچاری دەبن:** ١ ـ توُشی چارەڕەشی و ڕەزیلی دەبن ٢ ـ توُشی مەجبوُری دەبن [ف] ١ ـ خوار و ذلیل می‌شوند ٢ ـ دچار ناگزیری می‌شوند

٥ **قەرەبەخت:** چارەڕەش، کلۆڵ، بەدبەخت [ف] سیەبخت

٧ **چپە:** ١ ـ سرتە، سرکە ٢ ـ دەنگی دلۆپە داکەوتن [ف] ١ ـ پچ پچ ٢ ـ صدای چکیدن قطره

١١ **کۆڕ:** جێگەی کۆ بوُنەوە [ف] جای تجمع، مجلس

## «سوُڕەی حەشر ـ لاپەڕی ٥٤٥»

**حەشر: ١ ـ ڕۆژی قیامەت، سەڵا، ڕۆژی پسات ٢ ـ بریتی لە هەرا و هوریای تێکەڵ و پێکەڵ (مەبەس خڕ کردنەوە بۆ دەر کردن) [ف] ١ ـ روز قیامت ٢ ـ کنایە از شلوغی**

٢ **تەرە کردن:** بریتی لە ئاوارە (مراد یەهوُدێکانی بنی نەزیر بوُن کە لە دەور و بەری مەدینەی دەژیان) [ف] کنایە از آوارە

٢ **پارازتن:** ئاگاداری کردن [ف] نگهداری

٢ **پارێز:** ١ ـ هجوم لە نخافڵ ٢ ـ بۆسە، کەمین ٣ ـ پەرێز [ف] ١ ـ یورش غافلگیرانە ٢ ـ کمین ٣ ـ پرهیز

١١ **سونف:** ١ ـ هاوپیشە ٢ ـ سنف، ئامپا، هاوپا [ف] ١ ـ همکار ٢ ـ صنف

١١ **گوێڕایەڵ:** بەر فەرمان [ف] فرمانبردار

١٤ **ناکۆکی:** ١ ـ مابەین ناخۆشی ٢ ـ بێ کەیفی [ف] ١ ـ کدورت، میانە خوب نبودن ٢ ـ بدحالی

١٨ **چەی:** مەبەس چ ئاکار و ڕەوشت و گومان و خەیاڵاتێکە [ف] منظور چە کار و روش و خیالاتی

٢٢ **ئەوتۆ:** ئەو جۆرە، وتۆ، ئەوها [ف] این طور

٢٣ **هێمنایەتی:** دنیای ئارام و بێ کێشە و شەڕ [ف] آرامش، امنیت کشور

٢٣ **هێمنی:** لەسەرخۆیی، ئاسوُدەیی وڵات [ف] آرامی، امنیت کشور

٢٣ **دەرۆست:** وەستان، پێوەستان، باشار [ف] تاب مقامت

٢٤ **وەدی هێن:** دروستکەر، داهێنەر [ف] مخترع

٢٤ **وێنەگەر:** شکڵ کێش، ئەسک‌کێش [ف] نقاش، صورتگر، عکاس

## «سوڕەی مومتەحینە - لاپەڕی ٥٤٩»

**مومتەحینە: ئەوەی ئازمۆن دەکا [ف] آن که امتحان برگزار می‌کند**

٤ **ڕکۆنی:** ڕق لە سگ [ف] کینەتوز، تودار

٤ **سگ:** زگ [ف] شکم

١٠ **گل:** ڕاگرتن [ف] نزد خود نگه داشتن

١٠ **گلا:** گش لا، هەموو لایەک [ف] همگی

## «سوڕەی سەف - لاپەڕی ٥٥١»

**سەف: ڕیز بەستن [ف] صف**

## «سوڕەی جومعە - لاپەڕی ٥٥٣»

**جومعە: جومعە، هەینی، هەینو، هەنی [ف] جمعە، آدینە**

١١ **پێوە:** ١ - بە یەکەوە ٢ - درێژە پێدان [ف] ١ - با هم ٢ - طول دادن

١١ **بە پێوە ڕاوەستان:** بە پاوە وێستان، نەجوڵان، نەبزوٗتن [ف] روی پا ایستادن

## «سوڕەی مونافیقوٗن - لاپەڕی ٥٥٤»

**مونافیقوٗن: دوٗ ڕوٚکان [ف] منافقان**

٢ **قەڵغان:** قەڵخان، مەتاڵ [ف] سپر

٤ **قەڵافەت:** ١ - سەر و سیما ٢ - بڵندی باڵا [ف] ١ - سیما، ریخت ٢ - بلندی قد

٦ **تەوفیر:** تەفاوەت، جیاوازی [ف] تفاوت

١٠ **تەک:** ١ ـ تاق ٢ ـ لەتی جوُت ٣ ـ لا، لەکن ٤ ـ دەگەڵ [ف] ١ ـ فرد ٢ ـ مقابل زوج ٣ ـ نزد ٤ ـ با

١٠ **تەکیە:** ١ ـ سەکۆی بەر دەرگا، خواجانە ٢ ـ دەروێشگە [ف] ١ ـ سکوی جلو در ٢ ـ خانقاه

١٠ **مردن تەک بە تەکیەوە دا:** مردن بگاتە سەری [ف] مرگش برسد

## ﴿سوُڕەی تەغابون ـ لاپەڕی ٥٥٦﴾

**تەغابون: تێشکان [ف] شکست خوردن، زیان دیدن**

١٨ **پەنامەکی:** نهێنی، بەدزییەوە [ف] سری، نهانی

١٨ **خۆیا:** ئاشکرا، دیار، بەرچاو [ف] آشکار، پیدا

## ﴿سوُڕەی تەڵاق ـ لاپەڕی ٥٥٨﴾

**تەڵاق: تەڵاق [ف] طلاق**

١ **دەریش نەچن:** مەبەس لەوەیەکە لە ماڵە مێردکانیان نەچنە دەرێ

٤ **مەزنیەتی:** گەورەیەتی (مەبەست خوداگەورەیەتی) [ف] بزرگواری (خدا بزرگوار اوست)

٤ **همێ:** ئومێد، ئاوات [ف] امید

٤ **ناهمێ:** ناهومێ، بێئومێد [ف] بی‌امید

٦ **بەخت:** خەرج، مەسرەف [ف] خرج

٩ **چەش:** ١ ـ چێژە، تام ٢ ـ چاو، دیدە، چەم [ف] ١ ـ مزە، طعم ٢ ـ چشم

## ﴿سوُڕەی تەحریم ـ لاپەڕی ٥٦٠﴾

**تەحریم: بە ناڕەوا دانان [ف] بە حرام دانستن**

٣ **نهێنی:** ١ ـ پەنامەکی، بە دزی‌یەوە ٢ ـ سوڕ (مەبەست ئەوەیەکە پێغەمبەر بە دزی لە لای حەفسەی ژنی گوتبوُی ئەمن نزیکی لە ماری‌یەی قبتی ناکەم، حەفسەش چوُبوُ بە عایشەی ڕاگەیاندبوُ) [ف] ١ ـ نهانی ٢ ـ سر، راز

٤ **خودێ:** خودا، اللّٰه [ف] خدا

٤ **مەزنیەتی:** گەورەیەتی [ف] بزرگواری

٤ **بەرکەتی:** شیاوی ڕێز لێ گرتن، هەڵکەوتە، زۆر زرینگ و بە کار [ف] شایستە و محترم

٥ **گەردەن کەچ:** ١ ـ گوێ بە فەرمان ٢ ـ خەمگین و کز [ف] ١ ـ گوش بە فرمان ٢ ـ افسردە و غمگین

١١ **ژنی فیرعەون:** مەبەس «ئاسیە»ی ژنی فیرعەونە [ف] منظور «آسیە» زن فرعون است

١٢ **وتار:** قسە بۆ خەڵک کردن دەر بارەی مەبەستێ [ف] سخنرانی، گفتار

## «سوورەی مولک ـ لاپەڕی ٥٦٢»

**مولک:** فەرمانڕەوایی، خۆنکاری [ف] فرمانروایی

١ **خۆنکاری:** پادشایی [ف] پادشاهی، فرمانروایی

٤ **داماو:** تێماو، مات و سەرگەردان [ف] ١ ـ مات ٢ ـ درماندە

٤ **ڕاماو:** ١ ـ دەبیرەوەچوگ ٢ ـ سەرگەردان [ف] ١ ـ در فکر فرو رفتە ٢ ـ سەرگردان

٥ **کەرستە:** ئەسپاباتێ کە شتێکی لێ درووست بێ، ئامراز [ف] اسباب، وسیلە

٥ **ڕاوەدوونان:** دانە پە، ڕاو نان [ف] دنبال کردن

٨ **شەق:** ١ ـ درز، تلیش ٢ ـ شڕ، نارەحەت [ف] ١ ـ شکاف ٢ ـ پریشان و دشوار

١١ **ئارا:** ١ ـ وجوود و بوون ٢ ـ جێگەی ژینی هەمیشەیی [ف] ١ ـ وجود داشتن ٢ ـ محل ثابت زندگی

١٥ **شانەوشان:** درێژایی ملەی کێو، یاڵە و یاڵی کێو (شانە و شان ڕێگەیە) [ف] طول تیغۀ کوە

١٦ **بە هەردا:** بە زەوینا، بە حەرزا، بە خاکا [ف] بە زمین، بە خاک، بە تُربَت

١٧ **زیخ:** خیز، وردکە بەردی بەر چەم، چەو [ف] شن، سنگ‌ریز

٢٢ **ئاسایی:** ١ ـ عادەتی، بەرانبەر بە یاسای کۆمەڵایەتی ٢ ـ وەکوو، ئاسا [ف] ١ ـ معمولی ٢ ـ مانند

## «سوڕەی قەڵەم ـ لاپەڕی ٥٦٤»

**قەڵەم: پێنوس، بنوس [ف] قلم**

١ **نڤیسین:** نوسین [ف] نوشتن

٢ **وەسا:** ئوسا، زانا لە کار [ف] استاد

٩ **نیان:** نەرم و ساف، (مەبەس مداراکردن) [ف] نرم و صاف

١٣ **ڕەزا:** ١ ـ تەرح و دیدار ٢ ـ قایل، ڕازی، ڕەدا [ف] ١ ـ سیما و قواره ٢ ـ راضی

١٣ **ڕەزا قورس:** ڕەزا تاڵ، تێسک قورس [ف] گران‌جان، دوست نداشتنی

١٣ **زۆڵ:** بیژۇ، بیژ، پیچ [ف] حرامزاده، غیر طبیعی

١٣ **سەپاندن:** بە زۆر تۆش کردن، بە ملدا هێنان [ف] تحمیل کردن

٢٠ **قاقڕ:** ١ ـ زەوینێ کە گیای لێ ناڕوێ ٢ ـ بریتی لە بنیادەمی ڕژد [ف] ١ ـ لم‌یزرع ٢ ـ کنایه از آدم خسیس

٣٠ **سەرکۆنە:** لۆم، سەرزەنشت [ف] سرزنش

٤٣ **ساق و چاق:** ساخ و قەڵەو [ف] سالم و چاق

٤٧ **خەت:** نوسین [ف] نوشتن

٤٨ **یارۆی:** کابرای، کاورای (مەبەس یۆنسە) [ف] فُلانی، یارو

## «سوڕەی حاققە ـ ٥٦٦»

**حاققە: کارەسات، قەومان، بەسەرهاتی ناخۆش [ف] رویداد ناگوار**

٧ **کۆتەر:** ئەستوراییی دار [ف] قطر درخت

٧ **ناوزڕاو:** ئابڕو نەماو (دەبێ مەبەس تێو بەتاڵ و هڵۆڵ بێ) [ف] روسیاه، رسوا

۱۱ **بوار:** دەراوی پەڕینەوە لە ئاو [ف]گدار

۱٦ **فشەڵە:** فشلەڵۆک، سست و شل و خۆ نەگرتوُ [ف] متخلخل، سست

۱٦ **فشەڵ:** سست و بی‌ناو [ف] متخلخل

۳۲ **شەتەک:** بەستنی توند [ف] سفت بستن

۳٦ **زام:** برین، ڕێش [ف] زخم

٤۱ **هەستیار:** ۱ ـ شاعیر، وێژەوان ۲ ـ هەستکار [ف] ۱ ـ شاعر و ادیب ۲ ـ احساس‌کننده

## ‹سوُڕەی مەعاریج ـ لاپەڕی ۵۶۸›

**مەعاریج: چەندپلە [ف] چند پلّە، چند پایە، چندین رتبە و مرتبە**

۱٦ **ئەنام:** ئەندام، ئازای لەش [ف] اندام

۱۹ **تابشت:** تاقەت، هێز و توان (مەبەس بێ سەبر و حەوسەلە و بێ‌پشوُ نائارام) [ف] نیرو، توان

۲۰ **ناگوزور:** دەس‌تەنگ، فەقیر [ف] تنگدست، بینوا

۲۱ **چکوُس:** چکوُد، ڕەزیل، رژد، نان‌نەخۆر [ف] خسیس

## ‹سوُڕەی نوُح ـ لاپەڕی ۵۷۰›

**نوُح: پێغەمبەرێکی خودا [ف] یکی از پیامبران خدا**

٤ **ئاکام:** ۱ ـ کاتی مەرگ، هەنجەل، ئەجەل (ئەجەلی خودایی) ۲ ـ دوماهی، دوایی، پاشنە [ف] ۱ ـ اَجَل ۲ ـ انجام

٦ **ڕەوەک:** قوشمی، تۆڕ، ڕەوک، سرک [ف] رموک

٨ **هەمیسان:** دیسان [ف] دوباره، باز

١١ **پەڵە:** ١ ـ بارانی تیری دەخڵ ٢ ـ لەکە [ف] ١ ـ بارانی که زمین را سیراب کند ٢ ـ لکّه

١٣ **شکۆ:** پایەبەرزی، جەلال، گەورەیی [ف] شکوه و عظمت

٢٢ **جانانە:** ١ ـ ژنی زمان درێژ و سازنە و سەڵیتە ٢ ـ گراوی، ماشوُقە [ف] ١ ـ زن سلیطه ٢ ـ معشوقه

٢٢ **جـانانە:** دێـرەدا مـەبەس فـێڵێکی گـەورە و زەلام و زیـرەکـانە بـە مـەکر و گـزی و حیلەوە [ف] منظور حیلهٔ زیرکانه

٢٢ **سازنە:** ١ ـ زۆرناژەن، سازلێدەر ٢ ـ سازندە (بریتی لە بێشەرم و زمان درێژ) [ف] ١ ـ سُرنانواز، سراینده ٢ ـ سازنده

٢٢ **سەڵیتە:** ژنی زمان درێژی بێ حەیا [ف] زن بی‌حیا

## «سوُڕەی جین ـ لاپەڕی ٥٧٢»

**جین: جندۆکە، عەجنە، جند، جنۆکە، جن [ف] جن**

٩ **کوُڵە:** کروُشمە بۆگوێ گرتن لە خەڵک [ف] کِزکردن برای استراق سمع

١٠ **داروە:** دراوە [ف] داده شده

١٦ **زەبەندە:** فرە، بۆش، زۆر [ف] زیاد

## «سوُڕەی موززەممیل ـ لاپەڕی ٥٧٤»

**موززەممیل: بە جلکان داپۆشراو [ف] با لباس پوشیده شده**

٦ **شەو نخوُنی:** شەو بێداری [ف] شب بیداری

١٤ **هەژین:** ڕاژان، شەکانەوە، لەراندن [ف] جنباندن

١٤ **ڕەمڵ:** ڕەڵم [ف] ماسه

١٨ **شەقار:** ١ ـ لەت، دڕاو ٢ ـ شوێن و لەلە [ف] ١ ـ پاره و دریدن ٢ ـ شیار

٢٠ **هەر پێشبارێ بە ڕێی بکەن:** مەبەست هەر چاکـە و خـێرێکی کـە دەپـێشدا بـەجێو هـێناوە [ف] منظور خوبی و خیر را پیشاپیش بفرستید و به خدا قرض‌الحسنه دهید

## «سوڕەی موددەسسیر ـ لاپەڕی ۵۷۵»

**موددەسسیر: جلک بە سەر دادراو [ف] لباس روی سر انداخته شده**

۹ **تۆش:** ناخۆش، سەخت [ف] ناجور، سخت

۱٦ **لاسار:** ۱ ـ سەرسەخت ۲ ـ گوێ نەبیس [ف] ۱ ـ دیکتاتور ۲ ـ حرف نشنو، لجباز

۱۷ **هەڵچوُن:** بریتی لە تورە بوُن [ف] کنایه از خشمگین شدن

۲۸ **نە دەهێڵێ:** نە بە تەواوی نابوُدی دەکا و دەیمرێنێ [ف] منظور این است که نه به یکباره نابودش می‌سازد و نه رهایش می‌کند

۲۸ **نە واز دێنێ:** نە دەس هەڵدەگرێ [ف] نه دست برمی‌دارد، نه ول می‌کند و نه این که رهایش کند و بگریزد

۲۹ **پێستی مرۆ ڕەشەو دەکا و دەبرژێنێ:** پێس و چەرمی لەش ڕەش هەڵدەگێڕێ و برشتە و بریانی دەکا [ف] پوست بدن را سیاه و برشته می‌کند

۲۹ **ڕەشەو:** ڕەش [ف] سیاه

۲۹ **ڕەشە:** گەف، هەڕەشە [ف] تهدید

۵۰ **گۆڕە:** خەرگۆر، کەرەکێوی، گۆڕ [ف] گورخر

## «سوُڕەی قیامەت ـ لاپەڕی ۵۷۷»

**قیامەت: ڕۆژی هەستان، قیا، سەڵا، پەسڵان، ژیانەوەی دوای مەرگ [ف] قیامت**

۲ **ڕەخنەگر:** ۱ ـ عەیب لە شت گر ۲ ـ کونگر [ف] ۱ ـ ایرادگر ۲ ـ درزگیر و سوراخ‌گیر

۳ **پێشەگەل:** ئێسکەکان، هەستێکان [ف] استخوان‌ها

۵ **پێشەخۆی:** پێش خۆی (مەبەس ئەوەیە کە هەر دەیهەوێ گوناح بکا) [ف] جلوی خودش

۷ **مۆلەق:** دەرپەڕیوی زەقی بێ جوڵە [ف] برآمده بی حرکت

۲٤ **دیم:** ڕوخسار، دەم و چاو، ڕوُ [ف] رخسار

۲۹ **لەتەر:** پۆز، بەلەک [ف] ساق

۳۰ **هاژوُتن:** لێخوڕین (مەبەس وەپێشە خۆ دان) [ف] راندن

۳۳ **بە خۆ بادانەوە:** لە خۆبایی بوُن و بە فیزەوە [ف] ۱ ـ با تکبّر و نخوت

۳٦ **وڵ:** بەڕەڵا، گوم [ف] مهمل

## «سوُڕەی ئینسان ـ لاپەڕی ۵۷۸»

**ئینسان: مرۆ، بەشەر [ف] انسان**

۲ **ئاوێتە:** ئاویتە، لێکدراو، تەف لە هەف [ف] آمیختە، درهم

۵ **چەم:** ۱ ـ چۆم ۲ ـ چاو [ف] ۱ ـ رودخانە ۲ ـ چشم

۵ **کافوُر:** شیرەی وشکەوە بوُی دارێکە سپی و بۆن خۆشە [ف]کافور

۷ **لە خۆ گرتن:** لە سەر خۆ پێویست کردن [ف] بر خود لازم دانستن، نذر

۷ **گلا:** ۱ ـ گش لا، هەموُ لایەک ۲ ـ پەڕی، پەرت بوُ [ف] ۱ ـ همگی ۲ ـ پرت شدن

۷ **تەنین:** چنین [ف] تنیدن

۷ **تەنینەوە:** ۱ ـ داگری، داگرتن ۲ ـ گیرۆیی [ف] ۱ ـ سرایت ۲ ـ واگیری

۱۰ **مەترسی:** ۱ ـ سام، عەیبەت ۲ ـ جێگای بە ترس [ف] ۱ ـ ترس ۲ ـ سهمناک

۱۲ **حەریر:** ۱ ـ پارچەی ئاوریشم ۲ ـ هەڵوای دۆشاو [ف] ۱ ـ پارچۀ حریر ۲ ـ حلوا

۱٤ **سێوەر:** سێبەر [ف] سایە

۱۵ **دەفر:** جام، قاب، زەرک [ف] ظرف، جام

۱۵ **مینا:** شوُشە [ف] شیشە، بلور

۱٦ **ڕاس:** ڕەوا، ڕاست [ف] درست

۱٦ **ڕاس:** ۱ ـ دژی خوار ۲ ـ ڕێگەی بێ پێچ [ف] ۱ ـ ضد کج ۲ ـ مستقیم

۱٦ **قاس:** ئەندازە [ف] اندازە

۱۷ **زەنجەفیل:** بنە گیایە کی بۆری تیژە لە لاوە دەهێنرێ [ف] زنجبیل

۲۱ **سفت:** سخ، تەنراوی زۆر بە پۆی سفت [ف] سفت تنیدە

۲۱ **پۆ:** تێوەدانی تەون، هەواڵی رایەڵ [ف] پود

۲۹ **بەدی دە کا:** دەپێش دە گرێ [ف] در پیش میگیرد

## ﴿سوُڕەی مورسەلات ـ لاپەڕی ۵۸۰﴾

**مورسەلات: ناردراوەکان [ف] فرستادە شدەها**

٤ **هەڵوەژاردن:** ۱ ـ هەڵوەژارتن، لێک جیا کردنەوە ۲ ـ ڕێک و پێک کردن [ف] ۱ ـ از هم جدا کردن ۲ ـ مرتّب و منظّم کردن

٤ **هەڵاواردن:** لێک جیا کردنەوە، هاوێر [ف] از هم جدا کردن

٦ **قەتاندن:** ۱ ـ پساندن ۲ ـ تەواو کردنی کار [ف] ۱ ـ گسستن ۲ ـ تمام کردن کار

٦ **بۆ بەهانە لێ قەتاندن یا ترساندن:** بۆ بەهانە لێبڕین یا ترساندن [ف] برای رفع عذر و بیم دادن (از عذاب و عقوبت الهی)

۱۱ **وادە:** ۱ ـ مۆڵەت، ماوە، قانە ۲ ـ جەنگە، وەختی شتێ [ف] ۱ ـ مهلت ۲ ـ موسم

۳۰ **چوکڵە:** ۱ ـ ددانە ۲ ـ ددانەی پیت [ف] ۱ ـ دندانە ۲ ـ دندانۀ حرف (منظور سە شاخە است)

۳۳ **دەبێژی:** دەڵێی (مەبەس وا گومان دە کەی) [ف] میگویی

**دیێژە:** حەز کا، بیهەوێ، ئارەزوُ کا، ئیشتیا کا، وازی بێ [ف] مایل باشد

## «سوڕەی نەبە ـ لاپەڕی ۵۸۲»

**نەبە:** **دەنگ و باس، وڵام [ف] خبر**

۵ **هەمیسان:** دیسان، هەمیس [ف] دوباره، بار

۱۳ **ورشە:** گرشه، بریقه [ف] درخشش

۱٦ **چڕ:** لێڕەواری پڕ دار [ف] جنگل انبوه

۲۱ **بەرەگە:** ۱ ـ جێ گەڕانەوەی ئاو ۲ ـ ڕێبازی نێچیر کە ڕاوکەر پێشی دەگرن [ف] ۱ ـ سد ۲ ـ برغاب

۲۷ **هێڤیدار:** ۱ ـ ئاواتەخواز ۲ ـ بە هومێد [ف] ۱ ـ آرزومند ۲ ـ امیدوار

۳٦ **سەروبەر:** ۱ ـ تەواو، بە تەواوی ۲ ـ سازی و ئاسوُدەیی لە ژیاندا [ف] ۱ ـ کاملاً بدون نقص ۲ ـ سر و سامان

۳۷ **بیدوُنن:** ئەوی بیدوێنن [ف] با او گفتگو کنند

۳۷ **دوین:** قسه کردن، دوان [ف] گفتن، سخن گفتن، سخنرانی

۳۸ **ودم:** ممباره کی، پیرۆزی [ف] شگون، یمن، اجازهٔ مخصوص از پیر طریقت به مرید

٤۰ **وێڕوُ:** ئەوێ ڕۆژی [ف] آن روز

٤۰ **دیێژە:** ۱ ـ دەڵێ ۲ ـ ئارەزوُکا [ف] ۱ ـ می‌گوید ۲ ـ آرزو کند

٤۰ **ئاخ:** ۱ ـ خاک، خوّڵ ۲ ـ خۆزیا ۳ ـ هاوار لەبەر ئازار [ف] ۱ ـ خاک ۲ ـ کاشکی ۳ ـ حرف درد، آخ

## «سوڕەی نازیعات ـ لاپەڕی ۵۸۳»

**نازیعات: هەڵدێن و ئاوا دەبن [ف] نمایان و ناپیدا می‌شوند، طلوع و غروب می‌کنند**

۱۱ **کلۆر:** ناو بەتاڵ [ف] میان تهی

۱۸ **توا:** دەیەوێ، دەخوازێ [ف] می‌خواهد، آرزو می‌کند

١٨ **توای:** دەتهەوێ، دەخوازی [ف] می‌خواهی، میل داری

٢١ **ئەشقیا:** ئەشقی [ف] یاغی

٢٥ **گیرۆدە:** ١ ـ گرفتار ٢ ـ هۆگر، ئۆگر، خوُ پێ گرتوُ، ئالوُدە ٣ ـ ئەڤیندار [ف] ١ ـ گرفتار ٢ ـ اُنس گرفته ٣ ـ عاشق

٢٨ **قەوارە:** قەبارە، بارست [ف] حجم

٣٠ **تل:** ١ ـ بزوُتن لە سەر لا، خلار، گلار ٢ ـ قامک ٣ ـ ورگ، عوُر، گیپاڵ [ف] ١ ـ غلت ٢ ـ انگشت ٣ ـ شکمبه

٣٨ **بژاردوُە:** ١ ـ نەقاندوُە ٢ ـ چاک لە خەراپ جیا کردوە [ف] ١ ـ برگزیده است ٢ ـ خوب را از بد جدا کرده

**نەقان:** بژاردن، هەڵبژاردن [ف] انتخاب

## (سوُڕەی عەبەس ـ لاپەڕی ٥٨٥)

**عەبەس: ڕوُ گرژ بوُن [ف] اخمو شدن**

١٥ **ڕاسپاردە:** ١ ـ کەسێ کە کارێکی پێ سپێردراوە ٢ ـ ناردراو بۆ کارێک [ف] ١ ـ سفارش شده ٢ ـ فرستاده

٣٧ **پەرژیان:** پەرژان [ف] پرداختن به کار

٣٧ **پەرژان:** گوێ پێدان، خەریک بوُن [ف] مشغولیّت

٣٧ **ناپەرژێتە:** نایهاوێتە، نایخاتە (نایخاتە سەر کەسی تر) [ف] نمی‌اندازد

٤١ **سیان:** ١ ـ قورم، دوُدە، دوُکەڵی لە دیوار و دەفر نیشتوُ ٢ ـ ژمارە سێ [ف] ١ ـ دوده ٢ ـ عدد سه

## (سوُڕەی تەکویر ـ لاپەڕی ٥٨٦)

**تەکویر: تۆپەڵ کردن، بە سەر یەکا هاتن، لە سەر یەکا کۆم کران [ف] گرد کردن**

**تۆپەڵ:** گرۆوەر، خڕ، لە سەر یەک کۆم کراو، بە سەر یەکا هاتوُ [ف] گرد

**کۆم:** ١ ـ کۆ، تۆپەڵ، کۆگا ٢ ـ پشت کوُڕ ٣ ـ قنگ [ف] ١ ـ توده ٢ ـ کوژپشت ٣ ـ مقعد

٢ **پەژمەرین:** ژاکان، سیس بوُن [ف] پژمردن

٦ **هەلێ:** مەبەست ئەو بەرد و گاز و تۆفانەیە کە لە ئاگرپژێنی نێو دڵی عەردرا لە زەریاوە سەر هەڵدەدەن [ف] منظور گدازەها و گازها و توفان‌های آتشین درون زمین که از دریا سر برآورند

٦ **هەلی:** ١ ـ توایەوە ٢ ـ حەلی، زڕ ٣ ـ تاوێک [ف] ١ ـ ذوب شد ٢ ـ ناتنی ٣ ـ دمی، لختی
**ئاگرپڕژێن:** کێوێ کە سەرەکەی ئاگر دەپڕژێنێ، ئاگری [ف] آتشفشان

٨ **دۆت:** کچ، قیز، کیژ [ف] دختر

٢٠ **خودێ:** ١ ـ خودا ٢ ـ خاوەن [ف] ١ ـ خدا، اللّه ٢ ـ صاحب

٢١ **متمانە:** بڕوایی، خاترجەمی [ف] اطمینان

٢٣ **یێسۆ:** ١ ـ بێ گومان، ڕاست، دروست ٢ ـ بۆنی لۆکەی سوُتاو [ف] ١ ـ بی‌گمان ٢ ـ بوی پنبهٔ سوخته

## «سوُڕەی ئینفیتار ـ لاپەڕی ٥٨٧»

**ئینفیتار: قەڵشین، درز بردن [ف] شکافتن**

١٧ **کوُ:** ١ ـ چلۆن، چۆن ٢ ـ کام جێ [ف] ١ ـ چطور ٢ ـ کجا

١٧ **لە کوُ:** لە کام جێگە [ف] از کجا؟ کجا

١٧ **لە کوێ:** لە کوُ [ف] کجا، از کجا

١٧ **لە کۆیڕا:** لە کوُڕا، لە کام شوێنەوە [ف] از کجا

١٨ **کوُت:** چلۆنت، چلۆن [ف] چگونە

## «سوُڕەی موتەففیفین ـ لاپەڕی ٥٨٧»

**موتەففیفین: کەمفرۆشان (کەمکەرەوەکان لە فرۆشتنی کاڵا لە کاتی کڕین و فرۆشتندا) [ف] کاهندگان از جنس و کالای مردم به هنگام خرید و فروش**

٧ **سیایی:** سیاهی، سیاهە [ف] لیست، سیاهە

٢٦ **میشک:** عەمبەر [ف] عنبر

٢٧ **ئاوێته:** ئاویته، تێکەڵاو، تێکەڵ [ف] آمیخته

٢٧ **تەسنیم:** چۆمێکە لە دنیای دی دایە [ف] رودی در قیامت

## ﴿سوُڕەی ئینشیقاق ـ لاپەڕی ٥٨٩﴾

**ئینشیقاق: لەت و پەت بوُن [ف] تکه تکه شده، پاره پاره**

## ﴿سوُڕەی بوُروُج ـ لاپەڕی ٥٩٠﴾

**بوُروُج: قەڵاکان [ف] دژها، قلعەها**

١٢ **هەڵمەت:** پەلامار، هجوُم، شاڵاو [ف] حمله

١٢ **حەستەم:** زۆر دژوار، سەخت [ف] دشوار

٢٢ **تەتەڵە:** پارچە تەختە یان پارچە بەردی پانکەڵە بۆ لە سەر نوُسین [ف] لوح

## ﴿سوُڕەی تاریق ـ لاپەڕی ٥٩١﴾

**تاریق: شەو خۆ ڕا دەنێ [ف] به هنگام شب پدیدار میگردند**

٦ **تراو:** شل، بەرانبەری خەست [ف] آبکی

٧ **پشت و بەرمەلان:**

٩ **خۆیا:** ئاشکرا، دیار، بەرچاو [ف] آشکار، نمایان

١٤ **لاقردی:** لاقرتی، گاڵته وگەپ [ف] شوخی و تفریح

## ﴿سوُڕەی ئەعلا ـ لاپەڕی ٥٩١﴾

**ئەعلا: هەرە بەرز [ف] اعلا، بلندپایه**

١٧ **بە پێزتر:** بەکێش و هێزتر [ف] (پاینده‌تر)

١٧ **پێز:** کێش و هێز ٢ ـ ماک و ڕەگەز [ف] ١ ـ کش و تاب ٢ ـ اصل و ماده

## «سوڕەی غاشیە ـ لاپەڕی ٥٩٢»

**غاشیە: داپۆشەری هەموو [ف] فراگیر و دربرگیرندۀ همه چیز**

٦ **دڕک:** چقڵ، دڕوو [ف] خار

١٠ **بەرز:** بڵند [ف] بلند

١٠ **تەرز:** جوان و لەبار [ف] زیبا و دلپسند

١٠ **بەرز و تەرز:** بڵند و جوان و لەبار [ف] بلند و زیبا و دلپسند

١٥ **باڵگە:** باڵشت، سەنیر، سەرین [ف] بالش

٢٠ **هەراو:** گوشاد، فرەه [ف] گشاده، گشاد

## «سوڕەی فەجر ـ لاپەڕی ٥٩٣»

**فەجر: بەرەبەیان [ف] پگاه، بامداد**

٧ **ئەستوون:** کۆڵەکە، دار یان بەردی درێژکە وەبەر بانی دەدەن، ستوون [ف] ستون

١٩ **هەڵپە:** ١ ـ پەلە ٢ ـ تەماح [ف] ١ ـ شتاب ٢ ـ آز، شره

٢٧ **ڕەخسیو:** ڕەخساو، پەیدا بوی بە هەڵکەوت [ف] بە وجود آمدۀ اتفاقی، نجات پیدا کردە، رستگار شده

٢٧ **لە خەم ڕخسیو:** لە خەم ڕەخساو، لە خەم لێخواردن ڕزگار بووگ [ف] بالیدن، نمو کردە، از مراقبت بی‌نیاز شده

٢٧ **لە خەم ڕەخسیو:** لە خەم ڕەخساو [ف] مطمئن و دل آرام، آسودەخاطر

## «سوڕەی بەلەد ـ لاپەڕی ٥٩٤»

**بەلەد: باژێر، شار [ف] شهر**

٤ **جسن:** ١ ـ بنچینە، نەژاد ٢ ـ عەسڵزادە، ڕەسەن [ف] ١ ـ نژاد ٢ ـ نجیب

١٠ **هات و نەهات:** خۆوبەخت، هات و پات (مەبەست ڕێگای چاک و خەراپە) [ف] بستە بە شانس (منظور راه خیر و شر است)

۱۱ **هەڵەت:** زەردوماهی زۆر سەخت [ف] پرتگاه سخت در کوه

۱۶ **خاکەسەر:** بەلەنگاز، قەرە بەخت، کڵۆڵ [ف] خاکسار

۱۶ **بەلەنگاز:** بێچارە، بەستەزمان، نەدار [ف] بیچارە، بینوا

۱۷ **خۆگری:** ۱ ـ سەبر کردن، حەوسەلە [ف] ۱ ـ صبر و حوصله ۲ ـ تحمّل

## «سوڕەی شەمس ـ لاپەڕی ۵۹۵»

**شەمس: خۆر، ڕۆژ [ف] خورشید، مهر**

۱۱ **ڕادە:** ۱ ـ ئەندازە ۲ ـ چلۆنەتی ۳ ـ بارست [ف] ۱ ـ اندازە ۲ ـ کیفیت ۳ ـ حجم

## «سوڕەی لەیل ـ لاپەڕی ۵۹۵»

**لەیل: شەو [ف] شب**

۲ **ڕانان:** بەرچاوی حەشامات دان [ف] به نمایش گذاشتن

## «سوڕەی زوحا ـ لاپەڕی ۵۹۶»

**زوحا: چێشتەنگاو [ف] هنگام چاشت، چاشتگاه**

**چێشتەنگاو:** قاوەڵتون، وەختی بەر لە نیوەڕۆ [ف] چاشت هنگام

۱۰ **دەرۆزەکەر:** پارسەک، گەدا [ف] گدا

۱۰ **تار:** هەڵوەدا و دوُرکەوتە [ف] آوارە و گریزان

۱۰ **تاراندن:** ڕەواندنی یەکجاری، تەرەکردن [ف] برای همیشه رمانیدن و گریزاندن

## «سوڕەی ئینشیراح ـ لاپەڕی ۵۹۶»

**ئینشیراح: هەراو کردن، گوشاد کردن [ف] گشاد کردن**

۳ **چەماندن:** خوار کردنەوە، داهێنان [ف] خم کردن

۷ **قوتار:** ۱ ـ ڕزگار ۲ ـ خلاس بوُن، بڕانەوە [ف] ۱ ـ رها ۲ ـ پایان

۸ **بلاڵێوە:** بپاڕێوە، بپاڕەوە [ف] لابەکن

## «سوُڕەی تین ـ لاپەڕی ۵۹۷»

**تین: هەنجیر، هەژیر، هژیر [ف] انجیر**

۷ **دەسخەرۆ:** فریودراو، خەڵەتاو [ف] فریب خورده

## «سوُڕەی عەلەق ـ لاپەڕی ۵۹۷»

**عەلەق: جلّتە، خوێنی بەستوُ، خوێنی بەسیاگ [ف] خون بسته**

**بەسیاگ:** داخراو، بەستراو [ف] بسته شده

٤ **بنوُس:** ئامرازی نوُسین [ف] قلم

۱۱ **کوُ:** چلۆن، چۆن [ف] چطور

۱۵ **پێشەسەر:** بالاتر لە توێڵ [ف] جاندانه سر

۱۵ **توێڵ:** ناوچاوان، ئەنی، هەنیە، جەمین [ف] پیشانی، جبین

۱۵ **دەنەوین:** دەبێ مەبەس تێ‌ڕوهاتن وگرتن وکێشان بێ [ف] منظور گرفتن وکشیدن است

۱۷ **یانە:** ۱ ـ نێو کۆمەڵ، دوُر ئاپۆرە ۲ ـ ماڵ، خانوُ ۳ ـ جێگەی سانەوە [ف] ۱ ـ وسط انبوه جمعیت ۲ ـ خانه ۳ ـ باشگاه، استراحتگاه

## «سوُڕەی قەدر ـ لاپەڕی ۵۹۸»

**قەدر: هەرە بەڕێز، حورمەت، عێزەت [ف] با ارزش و جای عزّت**

**قودب:** قوتب [ف] مرشد اعلی

۳ **بارتەقا:** بەرانبەر، هەمبەر [ف] برابر

۵ **بوُلێڵە:** نێوان شەو و ڕۆژان، تاریکی و ڕۆشناکی تێکەڵ لە ئێوار و بەیاندا [ف] هوای گرگ و میش

## «سوڕەی بەیینە ـ لاپەڕی ٥٩٨»

**بەیینە: بەڵگە، ڕوُنکەرەوە [ف] دلیل، حجّت و بُرهان**

١ **ترازان:** جیا بوُنەوە، لێک کلا بوُن [ف] از هم در رفتن

## «سوڕەی زیلزال ـ لاپەڕی ٥٩٩»

**زیلزال: بوُلەرزە، بوُلەرە، هەژانی زەمین [ف] زلزلە**

## «سوڕەی عادیات ـ لاپەڕی ٥٩٩»

**عادیات: ئەسپەکان کە لینگ دەدەن [ف] اسب‌های تازندە**

١ **چارەوا:** چارەوێ، وڵاخی سواری و باری [ف] چهارپا

٨ **ڕژد:** چرۆک، دەس قوُچاو، سەقیل [ف] خسیس

٩ **کەی:** کەنگێ، چە دەم، چە کاتێ [ف] چە وقتی

٩ **نوُک:** چاک [ف] نیک

## «سوڕەی قاڕیعە ـ لاپەڕی ٦٠٠»

**قاریعە: ئەوەی دەکوتێ، دلکوُت [ف] کوبندە، تپش قلب**

٣ **کوُت:** چۆنت، چلۆنت [ف] چگونە

## «سوڕەی تەکاسور ـ لاپەڕی ٦٠٠»

**تەکاسور: زۆر فرەخوازی [ف] افزون‌طلبی**

## «سوڕەی عەسر ـ لاپەڕی ٦٠١»

**عەسر: ١ ـ ئێوارە ٢ ـ ڕۆژگار [ف] ١ ـ هنگام عصر ٢ ـ زمان و روزگار**

١ **هەڕەت:** ١ ـ جەنگە ٢ ـ دەرفەت، کیس [ف] ١ ـ عنفوان، موسم ٢ ـ فرصت

## «سوڕەی هومەزە ـ لاپەڕی ٦٠١»

**هومەزە: ڕوُشکێن، تەریقکەرەوە، تەریقکەر [ف] خجالت‌دهندە، از رو برندە**

**تەریق:** شەرمەزار، فهێت‌کار، خەجاڵەت، تەرێق [ف] خجل، شرمندە

١ **هەوارە:** هاوار، وتەیە کە بۆ پەنا بردن بە خەڵک لە لێ‌قەوماندا [ف] بە دادم برسید

١ **خوسپ:** غەیبەت، پاش ملە گوتن [ف] غیبت

٩ **ئەستوُن:** کۆڵەکە [ف] ستون

## «سوڕەی فیل ـ لاپەڕی ٦٠١»

**فیل: فیل [ف] فیل**

**فیل:** حەبەشی‌یەکان لە یەمەنێ خۆنکاریان دەکرد. چونکە دیتیان خەڵک ڕوُ دە کەعبەی دەکەن، کلیسایەکیان لە سەنعایە دروست کرد تا خەڵک ڕوُ دە وێ بکا و بیکەنە جێگای خواپەرستی و تیجارەتی. بەڵام مەککە هەر وا جێی خواپەرستی مایەوە. سپای حەبەشە بە سەرکردایەتی ئەبرەهە بە سواری فیلان بۆ وێران کردنی کەعبەی وەڕێکەوت. لە ناوچەی مەغمەس نزێک مەککەی چەند تاقمە تەیر و باڵندەیان هاتە سەرێ کە سپای ئەبرەهە و فیلە زەلامانەیان لەبەین برد

## «سوڕەی قوڕەیش ـ لاپەڕی ٦٠٢»

**قوڕەیش: قوڕەیش، تایفەی قوڕەیش [ف] طایفهٔ قریش**

٢ **زۆزان:** ١ ـ هەوارگەی کۆچەران ٢ ـ کێوان [ف] ١ ـ ییلاق ٢ ـ کوهستان

## «سوڕەی ماعوُن ـ لاپەڕی ٦٠٢»

**ماعوُن: باربوُ، حاجەت [ف] وسایل امانتی**

٣ **هانە:** دنە، هان [ف] تحریک

## ﴿سوُڕەی کەوسەر ـ لاپەڕی ۶۰۲﴾

**کەوسەر: زۆر زۆر شت [ف] خیلی چیز از معنوی و مادّی**

۳ **ناتۆرە:** لەقەمی ناپسند [ف] لقب زشت

۲ **ناتۆر:** باغەوان [ف] باغبان

۳ **وجاخ:** ئاگردان، کوچکی ئاگر، تفک [ف] آتش‌دان

## ﴿سوُڕەی کافیروُن ـ لاپەڕی ۶۰۳﴾

**کافیروُن: حەق‌شێرەوکان [ف] کافران**

## ﴿سوُڕەی نەسر ـ لاپەڕی ۶۰۳﴾

**نەسر: یاریدەدان [ف] یاری رساندن**

## ﴿سوُڕەی مەسەد ـ لاپەڕی ۶۰۳﴾

**مەسەد: سیرمەی دوباد [ف] طناب تافته از چرم**

**سیرمە:** سیرم، باریکەیەک لە چەرم [ف] نوار چرمی

**سیرم:** باریکەیەک لە چەرم [ف] نوار چرمی

۱ **شەلە:** شەل، پاسەقەت (مەبەس دەستی شکێ یا سەقەت بێ) [ف] لنگ، شل

## ﴿سوُڕەی ئیخلاس ـ لاپەڕی ۶۰۴﴾

**ئیخلاس: بێ خڵتە [ف] ناب و خالص**

۲ **جێ نیازە:** (مەبەست جێی نیازە) [ف] جای نیاز

## ﴿سوُڕەی فەلەق ـ لاپەڕی ۶۰۴﴾

**فەلەق: سپیایی بەرە بەیان، و بە مانای قەڵشینەوە [ف] سپیدهٔ صبح و بە معنای شکافتن**

۱ **ماک:** هەر ڕەگەز و بنچینەیێ کە شتی لێ پێک‌هاتوُە، هۆی دروس بوُن [ف] مادە

٣ ڕۆشە: ١ ـ بەڵا و بەسەرهاتی خەراپ ٢ ـ ڕۆش ٣ ـ ڕۆزە [ف] ١ ـ مصیبت وارده ٢ ـ تندخویی ٣ ـ فرسوده و زنگار زده

٣ ڕۆزە: ١ ـ کەچ و کرۆچ و ژەنگاوی ٢ ـ دەم و چاو ئاولاوی [ف] ١ ـ فرسوده و زنگار زده ٢ ـ آبله گون

٤ تۆش: تۆش، جەنگنی، بەدفەڕی (دەبێ تۆش بێ نە تۆش) جەنگنی و بەدفەڕی، مرۆڤی بێفەر و بێ ئاکار

٤ تۆش: ١ ـ مرۆڤی بێفەر و بێ ئاکار ٢ ـ هەوای زۆر سارد و بارانی ٣ ـ ڕۆ بە ڕۆ بە یەک گەیشتن [ف] ١ ـ آدم موذی و بداخلاق ٢ ـ هوای سرد و بارانی ٣ ـ با هم روبرو شدن

## «سورەی ناس، لاپەڕی ٦٠٤»

ناس: مەردم، خەڵک [ف] مردم

١ خودانی: ساحیب [ف] صاحب

٤ خۆ پەنا دەر: خۆ وەشاردوو [ف] خود را پنهان کرده